سەنتەری ڕوشنبیری کارا

# بەهەشت
# و
# بەهەشتیان






زانای پایەبەرز
محمد بن صالح العثيمين
و . پشتیوان حسن

# بەهەشت

# و

# بەهەشتیان

وەرگیراوە لە کتێبی ( مجالس شهر رمضان )

لە نوسینی

الشیخ محمد بن صالح العثیمین ( رحمه الله )

پوخت کردن و وەرگێڕانی

پشتیوان حسن

چاپی دووەم

١٤٣٤ کۆچی

**بنکەی سەرەکی بڵاوکردنەوە**

**«سەنتەری کارزان» چەمچەماڵ ، پشت بازاڕی دۆلارەکە**

**٠٧٧٠٧٧٢٦١١٤**

**بنکەکانی بڵاوکردنەوە :**

- کتێبخانەی پێشیل - هەولێر .
- تۆمارگای شافعی - هەولێر .
- کتێبخانەی صوهەیب - کۆیە .
- کتێبخانەی سوننە : سلێمانی - شەقامی مەولەوی
- کتێبخانەی ئیمان - سلێمانی تەلای کەشتی نوح .
- کتێبخانەی الأثر - سلێمانی - نزیك مزگەوتی داروغا .
- کتێبخانەی سیطە - چەمچەماڵ - پشت بازاڕی دۆلاردکە .
- کتێبخانەی زانستی بەسوود - کەلار
- کتێبخانەی کاروانی زانست - کفری

==============================

**سەرپەرشتی چاپ : کتێبخانە و تۆمارگای بەهەشت**

**کەلار - نزیك فلکەی ناو بازاڕ - تەنیشت چێشتخانەی شێروانە**

# سەنتەری ڕۆشنبیری کارا

سەنتەرێکی ڕۆشنبیری و بانگەوازی ئیسلامی و گشتی هەمە لایەنە ، نا حزبی و سەربەخۆیە ، هەوڵەکانی دەخاتە گەڕ بۆ سەرخستنی بەها بالاَکان.

بۆ تێگەیاندنی ڕۆڵەکانی کوردستان و کورد زمان بە بیروباوەڕی ئیسلامی ڕەسەن بە پێی بەڵگە و تێگەیشتنی باشترین پێشینەکانی ئوممەتی ئیسلام.

دروست کردنی تاکی دڵسۆز و کارا بۆ خزمەتی ئیسلام و نیشتمان بۆ ئەوەی هۆکاری پێشکەوتنی وڵات و خەڵکی بن..

بەرنامەی پەرستن و کار و بانگەواز ، بۆ ئەوەی خەڵکی دڵسۆز بە بەرچاوڕوونی تێبکۆشن و هەنگاو هەڵنێن.

ڕێکردنەوەی تەوەری گفتوگۆ و لێك تێگەیشتن بێ کورت هەڵهاتن و توندبوون ، تەنها بەڵگە و تاوتوێ کردنی بۆچوونەکان و یەکلابوونەوەی وتەکان و بۆچوونەکان لە ڕوانگەی بەڵگەو بنچینەکانی ئیسلام .

هەنگاونان بەرە و کۆمەڵگەیەکی ئیسلامی پەیوەست بە ئاینەکەیەوە ، فراوان لە کردار و گەورە لە بیرکردنەوە و جوان لە ڕەفتاردا.

ئامانجی هەموو کارەکانیشمان تەنها ڕەزامەندی خوای گەورەیە، وە پاشان خزمەت کردنی کۆمەڵگاکەمانە..

لە دوعای خێرتان بێ بەشمان مەکەن

# پێشەكی وەرگێڕ

إنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِيْنُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوْذُ باللهِ مِن شُرُوْرِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيْكَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُوْلُهُ.أما بعد:

**خوێنەری بەڕێز** : ئەم نامیلكەیەی بەردەستت لە دوو بەشی سەرەكی پێك هاتووە :

**بەشی یەكەم** : كورتەیەكە سەبارەت بە وەسفی بەهەشت وخۆشی و دیمەنە بێ وێنەو دڵڕفێنەكانی لە ژێر تیشی ئایەتە پیرۆزەكانی قورئان و فەرموودە صەحیحەكانی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).

**بەشی دووەم** : باس ئـاكارو سیفاتی بەهەشتیەكان دەكات واتە : باس لەو كارانە دەكات كە بە كردنیان بەهەشت بۆ خۆت مسۆگەر دەكەیت .

خوای گەورە من و ئێوەش بگێڕێت لە ئەهلی بەهەشت

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته

# بەشی یەکەم

# وەسفی بەهەشت

## لە ژێر تیشی ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان و فەرموودە صەحیحەکانی پێغەمبەر

( صَلَّی اللَّهُ عَلَیْهِ وَسَلَّمَ ).

الحمد لله رب العالمين، والعاقبة للمتقين، ولا عدوان إلاّ على الظالمين، والصلاة والسلام على إمام الأولين والآخرين، وقائد الغُرّ المحَجَّلين، وعلى آلهِ وأصحابه إلى يوم الدِّين، أما بعد:

براکانم پێشبڕکێ ودەستپێشخەری بکەن بۆ بەدەستهێنانی ئەو بەهەشتەی کە پانتاییەکەی بەقەد ئاسمانەکان وزەویە، شتگەلێکی وای تێدایە کە نەبەچاوبینراوەو نەبەدڵی هیچ کەسێکدا هاتووەو نەکەسیش بیستوویەتی، ئەودتا خوای پەروەردگار لەم ئایەتە پیرۆزانەدا بەڕوونی دەفەرموێت :

﴿مَثَلُ الْجَنَّةِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَـٰرُ أُكُلُهَا دَائِمٌ وَظِلُّهَا﴾(الرعد:٣٥) .

واتە: وەسف ووێنەی ئەو بەهەشتەی لەلایەن خوای میهرەبانەوە بەخەڵکی ئیمانداری پارێزکار بەڵێن دراوە بەم شێوەیەیەکە: لەبن درەختەکانیەوە چەندین ڕووبارو چەمە ئاوی جوان وخاوێن دەڕوا میوەجاتی وسێبەری و سەهەندی هەمووکاتیە دوایی نایە ونابڕێتەوە.

وە هەروەها دەفەرمویت : ﴿مَثَلُ الْجَنَّةِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ فِيهَا أَنْهَارٌ مِنْ مَاءٍ غَيْرِ آسِنٍ وَأَنْهَارٌ مِنْ لَبَنٍ لَمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُ وَأَنْهَارٌ مِنْ خَمْرٍ لَذَّةٍ لِلشَّارِبِينَ وَأَنْهَارٌ مِنْ عَسَلٍ مُصَفًّى وَلَهُمْ فِيهَا مِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ وَمَغْفِرَةٌ مِنْ رَبِّهِمْ﴾(محمد: ١٥).

واتە: نموونەو سیفەتی ئەو بەهەشتەی بە خۆپاریزان بەڵین دراوە لەپاشەڕۆژدا پێیان بدرێت بەم شێوەیەیە: ڕووباری زۆری لە ئاوی خاوێن ونەگۆڕاوی بێ بۆنی تێدایە، وە زۆر ڕووباری تێدایە لەشیری سپی وجوان کەبەهۆی مانەوە-وەك شیری دونیا- تامی نەگۆڕاوە (چونکە لە گوانی ئاژەڵ نایەتەدەرێ)، چەندین چەم وڕووباری تێدایە لەشەراب وعەرەقێك- کەبۆئەوانەی ئەیخۆنەوە- زۆر خۆش وبەمەزەیە واتە: دوورە لەهەر وەسفێکی عەرەقی دونیا، وەچەندان چەم وڕووباری تێدایە لەهەنگوێنی پاڵاوتەوبێگەرد، لەوێ جۆراوجۆری میوەیان بۆ هەیە، لێبوردن ولێخۆشبوونی پەروەردگاریشیان بۆ هەیە کەئەوە چاکترین شتە.

وە هەروەها دەفەرمویّت : ﴿وَبَشِّرْ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ كُلَّمَا رُزِقُوا مِنْهَا مِنْ ثَمَرَةٍ رِزْقاً قَالُوا هَذَا الَّذِي رُزِقْنَا مِنْ قَبْلُ وَأُتُوا بِهِ مُتَشَابِهاً وَلَهُمْ فِيهَا أَزْوَاجٌ مُطَهَّرَةٌ وَهُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾(البقرة:٢٥).

واتە: ئەی پێغەمبەر مژدە بدە بەوانەی کە بڕوایان بەخوا و پێغەمبەرو ڕۆژی دوایی هەیەو، کردەوەی چاك و پەسەندەکان ئەنجام دەدەن کەبێگومان بەهەشت گەلێکیان بۆهەیە، کەچەندین کانیاوو ڕووبار لەژێردرەختەکانیدا دێن ودەچن هەرکە لەو بەرهەم ومیوەی بەهەشتانەیان بۆدێنن ودەیچێژن دەڵێن: خۆهەر ئێستا لەمەتان بۆ هێناین، ئەمە هەر ئەو ڕۆزیەبوو کەپێشتر پێمان درا دیارە ئەو میوەجاتەی لەبەهەشتا بۆیان دەهێنرێ هەموو لەچاکی وباشیدا بەڕەنگ لەیەك دەچن بەڵام بەتام ومەزە لەیەك جیاوازن، لەو بەهەشتەشدا چەندین ئافرەت وهاوسەری پاك وخاوێنیان بۆ

ئامادەکراوەو بەهەتاهەتاییش لەوێ ئەمێننەوەو ژیانێکی خۆش دەبەنەسەر.

هەروەها دەفەرموێت : ﴿وَدَانِيَةً عَلَيْهِمْ ظِلالُهَا وَذُلِّلَتْ قُطُوفُهَا تَذْلِيلاً (١٤) وَيُطَافُ عَلَيْهِمْ بِآنِيَةٍ مِنْ فِضَّةٍ وَأَكْوَابٍ كَانَتْ قَوَارِيرَ (١٥) قَوَارِيرَ مِنْ فِضَّةٍ قَدَّرُوهَا تَقْدِيراً (١٦) وَيُسْقَوْنَ فِيهَا كَأْساً كَانَ مِزَاجُهَا زَنْجَبِيلاً (١٧) عَيْناً فِيهَا تُسَمَّى سَلْسَبِيلاً (١٨) وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُخَلَّدُونَ إِذَا رَأَيْتَهُمْ حَسِبْتَهُمْ لُؤْلُؤاً مَنْثُوراً (١٩) وَإِذَا رَأَيْتَ ثَمَّ رَأَيْتَ نَعِيماً وَمُلْكاً كَبِيراً﴾ (الإنسان:١٤-٢٠).

واتە: سایەوسێبەری درەختەکانی لێیانەوە نزیکە، تا زیاتر هەست بەخۆشی و ڕێزو حورمەت بکەن لێکردنەوەو چنینی میوەکەشیان ئاسانکراوە بۆیان، لەسوراحی وکاسەی زیودا شەرابیان بەسەردا دەگێڕدرێ بەقاپی زیوین کەدەکرێتە ئەو کوپ وکاسانەوە لەدەرکی میناو شوشەی تایبەتدا دروستکراون، هەموو کاسەو سوراحی خواردن وخواردنەوەیان

لەشوشـــەی زیـــوە کەبەئەندازەیـــەکی جـــوان وپێویـــست ودڵڕفێن(ساقیەکان) ئامادەیان کردووە بۆیان، شـەرابی ئاوێتـە بەزەنجەفیل وچۆمی سەرسـەبیل دەخۆنـەوە وەپێکێکیـان پـێ دەنۆشرێ تێکەڵەکـەی زەنجەفیلـە، وە لـە ئـاوی کانیـاوێکیش تێکەڵکراوە کەلەبەر خۆشقووتی پێـی دەڵـێن: سەلـسەبیل، وە لاوانێ کەهەر بـەجوانی دەمێننـەوە بەسـەریاندا دەگـەڕێن بـۆ خزمەتکردنیان شیاوی باسە هەرگیز پـیری وناشـرینی وگـۆڕان ڕوویان تێ ناکات، هەرکە دەیانبینی وادەزانیت مروارین وبـەو ناوەدا بڵاوبوونەتەوە، کـاتێ بەهـەر لایـەکی ئـەو بەهەشـتەدا دەڕوانیـــت نازونیعمـــەت وبەهەردیـــەکی فـــراوان ومـــوڵکێکی گەوردی بێ سنوور، واتە نازانی سەیری چی بکەیت وگـوێ بـۆ چی بگریت.

هەروەها دەفـەرموێت : ﴿فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٍ (١٠) لا تَسْمَعُ فِيهَـا لاغِيَةً (١١) فِيهَا عَيْنٌ جَارِيَةٌ (١٢) فِيهَا سُرُرٌ مَرْفُوعَـةٌ (١٣) وَأَكْوَابٌ مَوْضُوعَةٌ (١٤) وَنَمَارِقُ مَـصْفُوفَةٌ (١٥) وَزَرَابِـي مَبْثُوثَةٌ﴾ (الغاشية).

واتە: لەناو بەهەشتێکی بەرزو بڵنـدان، هـیچ قـسەو وتەیـەکی هیچ و پووچ و بـێ مانـای تیـا نابیـسن، بـەدائیم سەرچـاوەی ڕەوانـی تێدایـە، لـە چـەند لایەکـەوە ئـاوی خۆشـقوت دێـت ودەچـێت، هـەروەها چرپاوسیـستەم وچـەند تـەختێکی بـەرزی بـەنرخی لێیـەو کورسـی لەهـەموو لایەکـەوە بـەدەوری کانیاوەکـەدا ڕیزکـراوە(حـور العـین)یـشی لەسـەر دانیـشتووە، ولەبەردەمیاندا پەرداخی جوان ونەخشین دانـراوە، وپاڵەپـشتی جوان وڕازاوەی تیایە کەبەشێوەیەکی جوان وپەسەند ڕیزکراون، وە قاڵی وڕایەخی ڕەنگاوڕەنگی تیا ڕاخراوە.

وە هەروەها دەفەرموێت : ﴿يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِنْ ذَهَبٍ وَلُؤْلُؤاً وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ﴾(الحج:٢٣).

واتە: خشڵداردەکرێن لەوێدا بەبازنی زێڕومرواری وجل وبەرگی ئەوێشیان هەوریشمە.

هەروەها دەفەرموێت : ﴿عَالِيَهُمْ ثِيَابُ سُندُسٍ خُضْرٌ وَإِسْتَبْرَقٌ وَحُلُّوا أَسَاوِرَ مِنْ فِضَّةٍ وَسَقَاهُمْ رَبُّهُمْ شَرَاباً طَهُوراً﴾(الإنسان:٢١).

واتە: لەبەریاندایە پۆشاکیٚ لەئاوریشمی قەشەنگ ونەرم ونـۆڵ وجوان سەوزی تەنك، کەبەسەر ئاوریشمی ئەستووردا لەبەریان کـردووە، ڕازێنراوەتـەوە بـەبازن ودەسـتبەندی زیـو وەپـەروەردگاریان شـەرابێکی پـاك وپوخـت وخاوێنیـان پێدەنۆشیٚ.

هەروەها دەفـەرموێت : ﴿مُتَّكِئِينَ عَلَى رَفْرَفٍ خُضْرٍ وَعَبْقَرِيٍّ حِسَانٍ﴾(الرحمن:٧٦).واتە: لەسەر پشتی سەوزو قـاڵی نایاب- کەوێنەیان لە دونیادا نیە- شانیان داداوە.

هەروەها دەفەرموێت : ﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي مَقَامٍ أَمِينٍ (٥١) فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ (٥٢) يَلْبَسُونَ مِنْ سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ مُتَقَابِلِينَ (٥٣) كَذَلِكَ وَزَوَّجْنَاهُمْ بِحُورٍ عِينٍ (٥٤) يَدْعُونَ فِيهَا بِكُلِّ فَاكِهَةٍ آمِنِينَ﴾(الدخان).

واتە: بێگومان پارێزگاران لە جێگایەکی هێمن و ئاسایشدان، لە ناو چەندان باخ و سەرچاوەدان، لە بەر ئەکەن لە ئاوریشم و حەریری ناسك و ئەستوور هەموو بەرامبەری یەکن لەکۆڕی دانیشتنەکانیاندا، هەروەها وەسفمان کرد بۆت،هاوجووتمان کردوون، بەژنانی سپی، چاو گەورە، داوا دەکەن لەو بەهەشتانەدا هەر جۆرە میوەیەك حەزی لێ بکەن بێ ترس لە مردن و لە هەر شتێکی تر.

لەئایەتێکی تردا دەفەرموێت : ﴿الَّذِينَ آمَنُوا بِآيَاتِنَا وَكَانُوا مُسْلِمِينَ (٦٩) ادْخُلُوا الْجَنَّةَ أَنْتُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ تُحْبَرُونَ (٧٠) يُطَافُ عَلَيْهِمْ بِصِحَافٍ مِنْ ذَهَبٍ وَأَكْوَابٍ وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ الأَنفُسُ وَتَلَذُّ الأَعْيُنُ وَأَنْتُمْ فِيهَا خَالِدُونَ (٧١) وَتِلْكَ الْجَنَّةُ الَّتِي أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ (٧٢) لَكُمْ فِيهَا فَاكِهَةٌ كَثِيرَةٌ مِنْهَا تَأْكُلُونَ (٧٣) إِنَّ الْمُجْرِمِينَ فِي عَذَابِ جَهَنَّمَ خَالِدُونَ﴾(الزخرف)

واتە: بەندەکانم ئەوانەن کـە بەئایەتـەکانمان بڕوایـان هێنـاوەو، ملکەچی هەر فـەرمانی خۆمـان بـوون ، لەپاشـەڕۆژدا پێیـان دەوتـرێ: بـچنە بەهەشـتەوە خۆتـان وژنـەکانتان لەوپـەڕی کامـەرانی وخۆشـحاڵی ودڵـشادیدا، جـا کەنیـشتەجێ بـوون لەبەهەشتدا کاسەی زێڕینی پڕ لەخواردن وجامی پڕ لەشـەراب بەسەریاندا ئەگەڕێنرێ هەرچیش دڵ حەزی لێبکاو چاو چێژی لـێ بـەرێ لەوێـدا هەیـە وئێـوەش بەهەتاهـەتایی تێیـدا ئەمێننەوە، پێیان ئەوترێ: ئەمە ئەو بەهەشـتەیە کـە بـەهۆی کارەچاکەکانتانەوە پێتان دراو بەمیرات پێتان بڕا واتـە مـافی خۆتانە، میـوەی زۆری جۆراوجـۆری تێـدا هەیـە بۆتـان لێیـان دەخۆن، بێگومان تاوانباران لەسزای دۆزەخدان بەهەمیشەیی.

لە ئایەتێکی تردا دەفـەرموێت : ﴿فِيهِنَّ قَاصِرَاتُ الطَّرْفِ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنْسٌ قَبْلَهُمْ وَلا جَانٌّ (٥٦) فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُمَـا تُكَذِّبَانِ (٥٧) كَأَنَّهُنَّ الْيَاقُوتُ وَالْمَرْجَانُ﴾(الرحمن)

واتە: ژنانێکیان تێدایە تەنها سەیری مێردەکانی خۆیان دەکەن بەر لەو مێردە بەهەشتیانەیان کەسێ لەئادەمی ولەجنی لەگەڵیان جووت نەبووە، جا بەکام نیعمەت لە نیعمەتەکانی پەروەردگارتان باوەڕناکەن؟ حۆریەکان لە جوانی وساف وسووریدا دەڵێیت یاقوت وشیلانن.

**هەروەها لە هەمان سورەتدا دەفەرموێت :﴿فِيهِنَّ خَيْرَاتٌ حِسَانٌ (٧٠) فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ (٧١) حُورٌ مَقْصُورَاتٌ فِي الْخِيَامِ﴾**(الرحمن)

واتە: ژنانی ڕەوشت شیرین وڕوخسار جوانیان تێدایە، جا بەکام نیعمەت لە نیعمەتەکانی پەروەردگارتان باوەڕناکەن؟ ژنانی سپی چاوڕەشن لەناو خێوەت وچادرەکاندا دەرناچن.

**یان دەفەرموێت :﴿ فَلا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخْفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾**(السجدة:١٧).

واتە: ئیتر هیچ کەسێ نازانێ چ پاداشتێکی گرنکیان بۆ داشاراوە لەهۆیەکانی خۆشی وشادی چاوان ودڵ ئارامی

لەپاداشتی ئـەو کارانـەدا ئەنجامیانـداون وخۆیـان بـۆ مانـدوو کردووە.

**هەروەها دەفـەرمویت :** ﴿**لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَى وَزِيَادَةٌ وَلا يَرْهَقُ وُجُوهَهُمْ قَتَرٌ وَلا ذِلَّةٌ أُوْلَئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ**﴾(یونس:٢٦).

واتە: بۆ ئەوانەش چاکە دەکـەن پاداشـتی زۆرچـاك وبەهەشـت هەیـە وزیـاد لـەوەش دیتنـی ڕووی پـیرۆزی خـوای میهرەبـان وتەماشاکرنی، تۆزو غوبارو سەرشۆڕی لەدەم وچاویان نانیشێ هەرچۆنی لەدەم وچاوی دۆزەخیـەکان دەنیـشێ ئەوانـە یـارانی بەهەشتن وبەهەتاهەتاییش تێیدا دەمێننەوە ولێیدەرناچن.

**خوێنەرانی بەڕێز :** ئایـەت وفەرمایـشتی خـوای کـارجوان سەبارەت بە وەسف وباسی بەهەشت زۆرن و لەقورئانەکەیدا لە زۆر شـوێندا باسـی فـەرمووە، کـە هـەر لـە قورئـان دەکـەوێ گوزارشت لە وەها شوێنێکی بەچاو نەبینراویکات و بیهێنێتـە پێش چاو، تەنانەت ووردەکاریەکانیشی باس دەکات، لەتوانای

هیچ کەسێکدا نیە بەو جوانیە باسی لێوە بکات هەرچەندە زیرەك وبەتواناش بێت و ڕەوانگۆیش بێت، بۆیە ئێمەش زیاتر پەنامان بردۆتە بەر قورئان بۆ ئەو مەبەستە.

**ئێستاش دێینە خزمەت فەرموودەکانی پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) باسی بەهەشتمان بۆ بکات، ئەو پێغەمبەرەی کە بەهەشتی بەچاوی خۆی بینیوەو زاناترین کەسە بەو باسە، خوای گەورە بمانگێڕێ لە سەرنشینانی بەهەشت.**

ئەبوهورەیرە ڕەزای خوای لێ بێ دەفەرموێت: وتمان ئەی پێغەمبەری خوا باسی بەهەشت ودیوارەکانیمان بۆ بکە، ئەویش فەرمووی :

((لَبِنَةٌ ذَهَبٍ وَلَبِنَةٌ فِضَّةٍ ، وَمِلَاطُهَا الْمِسْكُ، وَحَصْبَاؤُهَا اللُّؤْلُؤُ وَالْيَاقُوتُ ، وَتُرَابُهَا الزَّعْفَرَانُ ، مَنْ يَدْخُلُهَا يَنْعَمُ وَلَا يبأسُ ، وَيَخْلُدُ وَلَا يَمُوتُ ، لَا تَبْلَى ثِيَابُهُ وَلَا يَفْنَى شَبَابُهُ))[رواه احمد والترمذي].

واتە: خشتێکی ئاڵتونەو خشتێکی زیوە، خۆڵەکەی میسکە، بەردە چەوەکەی مرواری و یاقوتە، تۆزەکەی زەعفەرانە،

ئەوەی بچێتە ناویەوە خۆشحاڵ وخۆشگوزەران دەبێ وهەرگیز بێزارنابێ، وە بەهەمیشەیی دەمێنێتەوە وزیندووەو نامرێت، جلوبەرگەکەی کۆن نابێ وگەنجێتیەکەی ناڕوات.

(خالد)ی کوڕی (عمیر العدوی) دەڵێ: (عوتبە)ی کوڕی (غزوان)(خوای لێ ڕازی بێت) وتارێکی بۆداین، سوپاس و ستایشی خوای کرد و پاشان فەرمووی: (( أَمَّا بَعْدُ، فَإِنَّ الدُّنْيَا قَدْ آذَنَتْ بِصَرْمٍ، وَوَلَّتْ حَذَّاءَ، وَلَمْ يَبْقَ مِنْهَا إِلَّا صُبَابَةٌ كَصُبَابَةِ الْإِنَاءِ يَتَصَابُّهَا صَاحِبُهَا، وَإِنَّكُمْ مُنْتَقِلُونَ مِنْهَا إِلَى دَارٍ لَا زَوَالَ لَهَا، فَانْتَقِلُوا بِخَيْرِ مَا بِحَضْرَتِكُمْ، وَلَقَدْ ذُكِرَ لَنَا أَنَّ مَا بَيْنَ مِصْرَاعَيْنِ مِنْ مَصَارِيعِ الْجَنَّةِ مَسِيرَةُ أَرْبَعِينَ سَنَةً، وَلَيَأْتِيَنَّ عَلَيْهَا يَوْمٌ وَهُوَ كَظِيظٌ مِنَ الزِّحَامِ))[رواه مسلم].

واتە: لەپاشان بزانن کە دنیا تازە بڕیاری خوا حافیزی داوەو، پشت پێی لێهەڵکردووە، ئەوەی لێی ماوەتەوە وەك چۆڕە ئاوێك وایە لە قاپێکدا، کەخاوەنەکەی بیڕێژێت، بزانن کە ئێوە دەگوێزنەوە بەرەو خانەیەك کە تەواو بوونی نیە، کە وابوو

بەچاکترین تووێشووەوە بەجێیبێڵن، چونکە ئێمە بۆمان باسکراوە کە نێوانی هەردوو لاشیپانی دەروازەی بەهەشت چل ساڵ ڕێیە، لەگەڵ ئەوەیشدا ڕۆژێك دێت جمەی دێت لە عەشامدا.

وەلە سەهلی کوڕی سەعدەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فەرمووی: (( فِي الْجَنَّةِ ثَمَانِيَةُ أَبْوَابٍ، فِيهَا بَابٌ يُسَمَّى الرَّيَّانَ، لاَ يَدْخُلُهُ إِلاَّ الصَّائِمُونَ ))[متفق عليه] واتە: بەهەشت هەشت دەرگای هەیە، دەرگایەکی پێی دەوترێ ڕەیان تەنها ڕۆژووەوانان پێیدا دەڕۆنە ژوورەوە.

وە ئەبوهورەیرە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فەرمووی : (( إِنَّ فِي الْجَنَّةِ مِائَةَ دَرَجَةٍ أَعَدَّهَا اللَّهُ لِلْمُجَاهِدِينَ فِي سَبِيلِهِ ، بَيْنَ كُلِّ دَرَجَتَيْنِ كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ ، فَإِذَا سَأَلْتُمُ اللَّهَ فَاسْأَلُوهُ الْفِرْدَوْسَ، فَإِنَّهُ وَسَطُ الْجَنَّةِ وَأَعْلَى الْجَنَّةِ ، مِنْهُ تَفَجَّرُ أَنْهَارُ الْجَنَّةِ ،وَفَوْقَهُ عَرْشُ الرَّحْمَنِ ))[رواه البخاري]

واتە: بەهەشت سەد پلەیە خوای گەورە ئامادەی کردووە بۆ تێکۆشەرانی ڕێبازەکەی، نێوان دوو پلە وەکو نێوان ئاسمان وزەوی وایە، جا ئەگەر داواتان لەخواکرد ئەوا داوای فیردەوسی لێ بکەن چونکە ئەوە بەرزترین ولوتکەی بەهەشتە ڕووبارەکانی بەهەشتیش لەوێوە سەرچاوەدەگرن وهەڵدەقوڵێن و سەردەوەیشی عەرشی خوای پەروەردگارە.

وەلە ئەبی سەعیدەوە (رضي الله عنه) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (( إِنَّ أَهْلَ الْجَنَّةِ لَيَتَرَاءَوْنَ أَهْلَ الْغُرَفِ مِنْ فَوْقِهِمْ كَمَا تَتَرَاءَوْنَ الْكَوْكَبَ الدُّرِّيَّ الْغَابِرَ مِنَ الْأُفُقِ مِنَ الْمَشْرِقِ أَوِ الْمَغْرِبِ، لِتَفَاضُلِ مَا بَيْنَهُمْ). قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، تِلْكَ مَنَازِلُ الْأَنْبِيَاءِ، لَا يَبْلُغُهَا غَيْرُهُمْ؟ قَالَ: (بَلَى وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، رِجَالٌ آمَنُوا بِاللَّهِ وَصَدَّقُوا الْمُرْسَلِينَ)). [صحيح مسلم]

واتە : بەهەشتیەکان باڵە خانە نشینەکانی سەرو خۆیان دەبینن. {هەرەك چۆن ئێوە ئەو ئەستێرە درەوشاوە دەبینن کە

لــە ئاسـۆی خـۆر هــەڵات بــەرەو ئـاوابوون دەچـێت، لەبــەر بەرزوبڵندی پلەی ئەوان لە مــانیتر. وتیــان: ئـەی پێغەمبــەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَــلّمَ): ئەمــە پلەوپایــەی پێغەمبەرانــە جگە لەوان کەس پێی ناگات؟ فـەرمووی: (بـەڵێ سـوێند بـەو کەســەی گیــانی مــنی بەدەسـتە پیـاوانێکن باوەڕیـان بـەخوا هێناوەو پێغەمبەرانیان بەڕاست زانیووە {پێیان دەگەن}.

**وە هەروەها ئەبی مالکی ئەشـعەری دەڵێـت: پێغەمبــەری خوا** (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) **فــەرمووی :** (( إِنَّ فِي الْجَنَّةِ غُرَفًا يُرَى ظَاهِرُهَا مِنْ بَاطِنِهَا ، وَ بَاطِنِهَا مِن ظَاهِرُهَا ، أعدَّها اللهُ لِمَنْ : أَطْعَمَ الطَّعَامَ ، وَأَدَامَ الصِّيَامَ ، وَصَلَّى بِاللَّيْلِ وَالنَّـــاسُ نِيَامٌ ))[رواه الترمذي عن علي وصححه الألباني].

واتــە: لەبەهەشــتدا ژوورگــەلێك هــەن لــەدیوی ناوەوەیــەوە دەرەوەی دیارە وە لە دەرەوەیشەوە ناوەوەی دیارە خوای گەورە ئامادەی کردووە بۆ ئەوانەی کە خواردن دەدەن ورۆژوو دەگـرن وشەونوێژ دەکەن لەکاتێکدا خەڵکی خەوتوون.

**وەلـە (أبـو موسـی) (خـوای لـێ ڕازی بێـت) دەڵێـت: پێغەمبەری خوا** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **فەرموویەتی :**

(( فِي الْجَنَّةِ خَيْمَةٌ مِنْ لُؤْلُؤَةٍ مُجَوَّفَةٍ، عَرْضُهَا سِتُّونَ مِيلًا، فِي كُلِّ زَاوِيَةٍ مِنْهَا أَهْلٌ مَا يَرَوْنَ الْـآخَرِينَ، يَطُـوفُ عَلَـيْهِمُ الْمُؤْمِنُ)). [متفق عليه]

واتە : (لەبەهەشتا خێوەتێك هەیە لە مرواری ناو بۆش، پانیەکەی شەست میلە، لەهەر سوچێکیدا هاوسەرێکی تێدایە، ئەوانی دیکە نابینن، بڕوادار بە سەریاندا دەگەڕێت).

**لە صحیحی موسلمدا هاتووە کە ئەبوهورەیرە(خـوای لـێ ڕازی بێت) دەڵێت: پێغەمبەری خـوا** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **فەرموویەتی :**

(( أَوَّلُ زُمْرَةٍ تَدْخُلُ الْجَنَّةَ مِنْ أُمَّتِي عَلَى صُورَةِ الْقَمَرِ لَيْلَـةَ الْبَدْرِ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ عَلَى أَشَدِّ نَجْمٍ فِي السَّمَاءِ إِضَاءَةً، ثُمَّ هُمْ بَعْدَ ذَلِكَ مَنَازِلُ، لَا يَتَغَوَّطُونَ وَلَا يَبُولُونَ، وَلَا يَمْتَخِطُونَ وَلَا يَبْزُقُونَ، أَمْشَاطُهُمُ الذَّهَبُ، وَمَجَامِرُهُمُ الْأَلُوَّةُ، وَرَشْحُهُمُ

الْمِسْكُ، أَخْلَاقُهُمْ عَلَى خُلُقِ رَجُلٍ وَاحِدٍ، عَلَى طُولِ أَبِيهِمْ آدَمَ سِتُّونَ ذِرَاعًا)).

له گێڕانەوەیەکی تردا بەم شێوەیە هاتووە : ((لا اخْتِلافَ بَيْنَهُمْ وَلا تَبَاغُضَ، قُلُوبُهُمْ قلبٌ واحدٌ يُسَبِّحُونَ اللّهَ بُكْرَةً وَعَشِيًّا)) لەگێڕانەوەیەکی تردا (( وأزواجهم الحور العين ))

واتە : (أبو هريرە)( ڕازی خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرموویەتی: (یەکەمین کۆمەڵ لە ئوممەتم کە دەچنە بەهەشتەوە، لەسەر شێوەی مانگی شەوی چواردەن، لەپاشان ئەوانەی لە دوایانەوە دێن لەسەر شێوەی پرشنگدارترین ئەستێرەن لە ئاسمانا، ئەوانەی دوای ئەوانیش چەند پلەیەکن، نەمیز دەکەن و نە پیسایی و، نە چڵمیان هەیە و نەبەڵغەم، شانەیان لە زێڕە و، بخوردانیان دار عودە، ئارەقیان میسکە، خووڕەوشتیان یەك خووڕەوشتە لەسەر باڵای باوکە ئادەمیان شەست مەترن).

هەروەها لە هەمان سەرچاوەدا لە جابرەوە، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)دەفەرموێت : (( إِنَّ أَهْلَ الْجَنَّةِ يَأْكُلُونَ فِيهَا , وَيَشْرَبُونَ ، وَلا يَتْفُلُونَ ، وَلا يَتَمَخَّطُونَ ، وَلا يَبُولُونَ "قَالَ : فَمَا بَالُ الطَّعَامِ ؟ قَالَ : " جُشَاءٌ وَرَشْحٌ كَرَشْحِ الْمِسْكِ ، يُلْهَمُونَ التَّسْبِيحَ وَالتَّحْمِيدَ ، كَمَا تُلْهَمُونَ النَّفَسَ))

واتە : (بەردەوام بەهەشتیەکان لەبەهەشتا دەخۆن و دەخۆنەوە، نە پیسایی دەکەن نە چڵمیان هەیە و، نەمیز دەکەن، بەڵکو پاشەڕۆکی خواردنیان جۆرە قرقێنەیەکە بۆنی هەر لە بۆنی میسك دەچێت. سوپاس و ستایشی خوا دەکەن وەك چۆن ئێوە هەناسە دەدەن).

وە لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێت : (( وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ إِنَّ أَحَدَهُمْ (أهل الجنة) لَيُعْطَى قَوَّةَ مِائَةِ رَجُلٍ فِي الْأَكْلِ وَالشُّرْبِ وَالْجِمَاعِ والشهوةِ ،تَكُونُ حَاجَةُ أَحَدِهِمْ رَشْحًا يَفِيضُ مِنْ جُلُودِهِمْ كَرَشْحِ الْمِسْكِ فَيُضْمِرُ بَطْنَهُ)). [أخرجه أحمد والنسائي ، قال المنذري في الترغيب والترهيب رواته محتج بهم، في الصحيح، ورواه الطبراني بإسناد صحيح وابن حبان في صحيحه والحاكم ]

واتــە: ســوێند بــەو کەســەی کــە نەفــسی محمـدی بەدەســتە هەریــەکێك لــە بەهەشــتیەکان هێزوتوانــای ســەد پیــاوی پــێ دەدرێــت لـــە خـــواردن وخواردنـــەوەو جیمـــاع وئـــارەزوو، وە پاشــەڕۆی هەریــەکێکیان لەشــێوەی ئارەقکردنــەوە لەپێــستدا دەردەچێت وەکو بۆنی میسك وورگیشی خاڵی دەبێت.

وە لە ئەنەسەوە (ڕازی خوای لێ ڕازی بێت)، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفـەرموێت :(( لَقَابُ قَوْسِ أَحَدِكُمْ ، أَوْ مَوْضِعُ قَدم فِي الْجَنَّةِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا، ولَوْ أَنَّ امْرَأَةً مِنْ نِسَاءِ الْجَنَّةِ اطَّلَعَتْ إِلَى الْأَرْضِ لَأَضَاءَتْ مَا بَيْنَهُمَا وَلَمَلَأَتْ مَا بَيْنَهُمَا رِيحًا وَلَنَصِيفُهَا(يَعْنِي الْخِمَارَ)خَيْرٌ مِنَ الـــدُّنْيَا وَمَـــا فِيهَا))[ البخاري]

واتــە: شــوێنێك ئەوەنــدەی دووری نــێوان هــەردوو ســەری کەوانــەکانتان ، یــان شــوێنی ئەوەنــدەی پێتــان لەبەهەشــتدا چاکترە لە دونیا و ئەوەیشی کە تێیدایە ، وە ئەگــەر ئافرەتێــك لــە ئافرەتــەکانی بەهەشــت ســەیری ســەر زەوی بکــات نێــوان

هەردوکیانی ڕوناك دەکردەوەو پڕی دەکرد لە بۆنی خۆش ، و سەرپۆشەکەشی چاکترە لە هەموو دونیاو ئەوەش کە تێیدایە.

وە لەئەنەسەوە ڕازی خوای لێ ڕازی بێت، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێت:

((إِنَّ فِي الْجَنَّةِ لَسُوقًا يَأْتُونَهَا كُلَّ جُمُعَةٍ، فَتَهُبُّ رِيحُ الشَّمَالِ فَتَحْثُو فِي وُجُوهِهِمْ وَثِيَابِهِمْ، فَيَزْدَادُونَ حُسْنًا وَجَمَالًا، فَيَرْجِعُونَ إِلَى أَهْلِيهِمْ فَيَقُولُونَ لَهُمْ : وَاللَّهِ لَقَدِ ازْدَدْتُمْ بَعْدَنَا حُسْنًا وَجَمَالًا، فَيَقُولُونَ: وَأَنْتُمْ وَاللَّهِ لَقَدِ ازْدَدْتُمْ بَعْدَنَا حُسْنًا وَجَمَالًا))[رواه المسلم].

واتە: لەبەهەشتدا بازاڕێك هەیە بەهەشتیەکان هەموو ڕۆژانی هەینیەك بۆی دەچن بای باکوور دەدات لە دەم وچاوکەلوپەلەکانیان بەهۆیەوە جوانی وشۆخ وشەنگیان زیاتردەبێت، جا کەدەگەڕێنەوە بۆلای هاوسەرەکانیان پێیان دەڵێن: سوێند بەخوا دوای ئێمە جوانیتان زۆرتربووە،

ئەمانیش بەھەمان شێوە بەوان دەڵێن: سوێند بەخوا ئێوەش جوانی و شۆخ وشەنگیتان زیادی کردووە.

لەھەمان سەرچاوە، لە ئەبی سەعیدەوە، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی : ((إذا دَخلَ أهلُ الجَنةِ الجَنةَ يُنَادِي مُنَادٍ: إِنَّ لَكُمْ أَنْ تَصِحُّوا فَلا تَسْقَمُوا أَبَدًا وَإِنَّ لَكُمْ أَنْ تَحْيَوْا فَلا تَمُوتُوا أَبَدًا، وَإِنَّ لَكُمْ أَنْ تَشِبُّوا فَلا تَهْرَمُوا أَبَدًا، وَإِنَّ لَكُمْ أَنْ تَنْعَمُوا فَلا تَبْأَسُوا أَبَدًا وَذلِكَ قول الله عزوجل﴿وَنُودُوا أَنْ تِلْكُمْ الْجَنَّةُ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾[الأعراف: ٤٣].

واتە: کاتێك ئەھلی بەھەشت دەڕۆنە بەھەشت بانگکەرێك بانگ دەکات ودەڵێت: ئەی بەھەشتیەکان ئیتر لەبەھەشتدا لەش ساغن وھەرگیز نەخۆش ناکەون وە زیندوون وھەرگیز نامرن وە ھەمیشە گەنجن وھەرگیز پیرولاواز نابن وە ھەمیشە لە خۆشحاڵیدان وھەرگیز بێزارنابن، ئەمەش فەرموودەی خوای پەروەردگارە کە دەفەرموێت: جا کەبەھەشت دەبینن لەلایەن

فریشتەکانەوە بانگ دەکرێن وپێیان دەگوترێ ئەم بەهەشتە ئەوەبوو کە بەڵێنتان پێدرابوو وا ئەمڕۆ بەهۆی ئەو کاروکردەوە چاکانەوە لەدنیادا ئەنجامتان دان پێتان دراو بوونە خاوەنی.

وە لە بوخاری وموسلیمدا هاتووە لە ئەبوهورەیرەوە، پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی :

((قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ : أَعْدَدْتُ لِعِبَادِي الصَّالِحِينَ مَا لا عَيْنٌ رَأَتْ ، وَلا أُذُنٌ سَمِعَتْ ، وَلا خَطَرَ عَلَى قَلْبِ بَشَرٍ، وَاقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ قَوْلَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ ﴿فَلا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخْفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾[السجدة: ١٧].

واتە: خوای گەورە دەفەرموێت: بەهەشتێکم بۆ بەندە چاکەکانم ئامادەکردووە کەبەچاو نەبینراوە و بەگوێ نەبیستراوە و بەدڵی هیچ کەسیشدا نەهاتووە، ئەگەر ویستان ئەم ئایەتە بخوێننەوە﴿ئیتر هیچ کەسێك نازانێ چ پاداشتێکی گرنگیان بۆ داشاراوە لەو ێیەکانی خۆش وشادی چاوان ودڵ

ئارامی لەپاداشتی ئەو کارانەدا ئەنجامیان داون وخۆیانیان بۆ ماندوو کردووە﴾.

وە لەصوهەیبەوە ڕەزای خوای لیٚ بیٚ، پیٚغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی : ((إِذَا دَخَلَ أَهْلُ الْجَنَّةِ الْجَنَّةَ ، نَادَى مُنَادٍ : يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ ، إِنَّ لَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ مَوْعِدًا يُرِيدُ أَنْ يُنْجِزَكُمُوهُ . فَيَقُولُونَ : مَا هُوَ ؟ أَلَمْ يُثَقِّلْ مَوَازِينَنَا ، وَيُبَيِّضْ وُجُوهَنَا ، وَيُدْخِلْنَا الْجَنَّةَ ، وَيزحزنا عن النَّارِ ؟قال فَيُكْشَفُ لهم الْحِجَاب فَيَنْظُرُونَ إليهِ ، فوالله ما أعطاهم الله شيئاً أَحَبُّ إِلَيْهِمْ مِنَ النَّظَرِ إِلَيْهِ ولا أقرَّ لأعينهم منهُ))[رواه مسلم].

واتە: کاتیٚك کەبەهەشتیەکان دەچنە بەهەشتەوە، بانگکەریٚك بانگ دەکات ودەلیٚت: ئەی بەهەشتیەکان! پەیمانیٚکتان لای خواهەیە ئەیەویٚ بۆتانی جیٚ بەجیٚ بکات، ئەوانیش دەلیٚن: ئەوە چی بیٚت؟ مەگەر خوا تەرازووی چاکەکانمانی قورس نەکردووەو ڕوومانی سپی نەکردووە و لەئاگری دۆزەخیش قوتارمانی نەکردووە؟ ئەفەرمویٚ: خوای گەورە پەردەوحجابەکە لادەبات و ئەوانیش سەیری خوای گەورە

دەکەن، سوێند بەخوا هیچ شتێکیان پێنەدراوە ئەوەندەی ئەو سەیرکردنەیان بۆ خوای پەروەردگار خۆش وئاسوودەبێت بەلایانەوە وخۆشبەختیان بکات.

وە لە فەرموودەکەی ئەبو سعیدی خودریدا ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە خوای پەروەردگار بەبەهەشتیەکان دەفەرموێت : ((أُحِلُّ عَلَيْكُمْ رِضْوَانِي ، فَلا أَسْخَطُ عَلَيْكُمْ بَعْدَهُ أَبَدًا)) واتە: ڕەزامەندی منتان بۆ حەڵاڵ بووە ئیتر هەرگیز لێتان توڕەنابم.

اللهم ارزقنا الخلد في جناتِك، وأحل علينا فيها رضوانك، وارزقنا لذةَ النظرِ إلى وجهك والشوقَ إلى لقائك من غيرِ ضرَّاءَ مُضِرَّةٍ ولا فتنةٍ مُضِلةٍ، اللهم صلِّ وسلم وبارك على عبدك ونبيك محمدٍ وعلى آلِهِ وأصحابِهِ أجمعين.

خوێنەرانی بەڕێزو یەکخواپەرست ئەوەی لەسەرەتاوە تا ئێستا خوێندتانەوەو بەرچاوتان کەوت بریتی بوو لە وەسفی بەهەشت وخۆشی و دیمەنە بێ وێنەو دڵڕفێنەکانی، سوێند بەخوا شایستەو شایەنی ئەوەیە کە کاری بۆبکرێ و کۆششی لەپێناودا بکرێ، وکێ برِکێی بۆبکرێ، جا ئەگەر پرسیار بکەی لە ڕێگەو شێوازو ڕێچکەی گەیشتن بەو بەهەشتە، ئەوا خوای میهرەبان لە قورئانە پیرۆزەکەی دا باسی فەرمووە بۆمان و دەفەرموێت :

﴿وَسَارِعُوا إِلَى مَغْفِرَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَوَاتُ وَالأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ (١٣٣) الَّذِينَ يُنْفِقُونَ فِي السَّرَّاءِ وَالضَّرَّاءِ وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنْ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ (١٣٤) وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ ذَكَرُوا اللَّهَ فَاسْتَغْفَرُوا لِذُنُوبِهِمْ وَمَنْ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ اللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا عَلَى مَا فَعَلُوا وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾(آل عمران).

واتە: پەلەو چەسپانی بکەن بۆ کردنی ئەوشتانە ئەبنە هۆی لێبوردنی پەروەردگارتان وچوونە بەهەشتێکی فراوانی واوە کە: هەر پانتاییەکەی بەئەندازەی ئاسمانەکان وزەویە کە ئامادەکراوە بۆ پارێزکاران، کە سیفاتەکانیان ئەمانەیە: لەخۆشی وناخۆشی وبوون ونەبووندا ئەوان دارایی دەبەخشن ورق وغەزەبی خۆیان لەکاتی تووڕەییدا دەخۆنەوەو کاری پێناکەن ولەهەڵەی مەردم خۆش دەبن وتۆڵەناسێنن خواش خێرخوازانی خۆشدەوێت، هەرکە کارێکی دزێوو ناشرین بکەن واتە گوناهێك ئەنجام بدەن یان ستەم لە خۆیان بکەن واتە گوناهی بچووك بکەن بەتالووکەوپەلە یادی خوا دەکەنەوەو داوای لێبوردن لە گوناهەکانیان دەکەن جا دەبێ بێجگە لەخوا کێ تاوان وگوناه بپۆشێ؟ جا ئەوانە لەسەر تاوان وگوناهێ کە زانیویانە هەڵەیە سووروبەردەوام نین.

ئەوەی لەم ئایەتـەدا باسـکرا چـەند سـیفەت وئاکـارێکی ئەهلی بەهەشت بوو، وا لـە خـوارەوە بـە ڕوونـی دیاریـان دەکەین:

**سیفەتی یەکەم:** ﴿الــــمُتَّقِينَ﴾ واتـە: خۆپـارێزەران یـان پارێزکاران، ئەوانەی خۆیـان لەخەشـم وسـزای خـوا دەپـارێزن، ئەوەش بە دروستکردنی بەربەست وقەڵغانێك دەبێـت لـەنێوان خۆیان وسزاو ڕقی خـوادا لەکاتێکـدا ئـەو بەربەسـتە دروسـت دەبێت بە: جێبەجێکردنی ئەوانەی فـەرمانیان پێکـراوە وەکـو گوێڕایەڵیـان بـۆ خـواو پاشـان بەچـاوەڕوانی پاداشـتەوە، وە دوورکەوتنەوە لەوانـەی کـە نـەهیان لێکـراوە دیـسان وەکـو گوێڕایەڵیەان بۆ خواو ترسێك لە سزاوتۆڵەی خوا.

**سیفەتی دووەم:** ﴿الَّذِينَ يُنْفِقُونَ فِي السَّرَّاءِ وَالــضَّرَّاءِ﴾ ئەوانە جۆرە کەسانێکن کە ماڵ دەبەخشن بـەو شـێوازەی کـە داخوازیان لێکراوە تێیدا لە زەکات وسەدەقات وبەخششەکانی تر بۆ ئەوانەی کـە مافیـان بەسـەریانەوە هەیـە، وەك بەخشین

لەکاتی جیهادو تێکۆشانداو ڕێگاکانی تری خێر کەلە خۆشی وناخۆشیدا دەبەخشن، لەکاتی خۆشی وبەختەوەریدا وایان لێ ناکات کە ماڵ وسامانیان خۆش بوێت وبەرەو ڕەزیلی ودەسگیرۆیی بیانبات بۆ ئەوەی زیادبکات، وەلە کاتی ناخۆشی وتەنگانەشدا وایان لێ نایەت کە دەستی پێوە بگرن ولەترسی ئەوەی ئەودك پێویستیان پێی بکەوێت بۆیە نەیبەخشن.

**سیفەتی سێیەم:** ﴿وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ﴾ ئەوانەن کە خۆیان دەگرن لەکاتی تووڕەبوونیاندا ستەم ناکەن و دەسدرێژی ناکەنە سەر کەسانی بەرانبەریان لەو ساتانەدا، بەڵکو بەئارامن و خۆڕاگرن.

**سیفەتی چوارەم:** (وَالْعَافِينَ عَنْ النَّاسِ) ئەوانەی کە لەوخەڵکانە خۆش دەبن کە ستەمیشیان لێیان کردووە و دەستی نارەوایان بۆ درێژکردوون، بۆ مافی خۆیان تۆڵەناسێنن لەکاتێکدا توانایشیان هەیە(لە بێدەسەڵاتیدانیە) چونکە

کاتێك کە خوای میهرەبان چاکەکارانی خۆشدەوێت واتە لێبوردن وبەخشینێك کە چاکە بێت وشوێنی ئەو بگرێتەوە، نەك لێبوردنێك کە ببێتەهۆی زیادە ڕق وقین ودڵساردی دروستکردن. هەر لەبەر ئەوەیە کە خوای بەسۆزوباڵادەست دەفەرموێت ﴿فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ﴾(الشورى: ٤٠).

واتە: ئەو کەسەی لێخۆشبوونی هەبێت و چاوپۆشی و چاکسازی بکات، ئەوە پاداشتی لای خوایە، بەڕاستی خوا ستەمکارانی خۆش ناوێت...

**سیفەتی پێنجەم:** ﴿وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ ذَكَرُوا اللَّهَ فَاسْتَغْفَرُوا لِذُنُوبِهِمْ﴾ فاحشە ئەو تاوانانەیە کە زۆر ناشیرین وقیزەونن. کە ئەوانەش تاوانە گەورەکانن، وەك: کوشتنی کەسێکی بێ تاوان بەناهەق، نازاردانی دایك وباوك، خواردنی ڕیبا، خواردنی ماڵی هەتیو، پشت هەڵکردن لەجەنگدا، زینا، داوێن پیسی، دزی وهاوشێوەکانی. بەڵام ستەم کردن لە نەفس (وەکو لە ئایەتەکەدا

هاتووە) ئەوا گشتگیرترە تاوانی بچوك وگەورەش دەگرێتەوە، جا بۆیە کەسێك کە تاوانێك ئەنجام دەدات بیری گەورەیی وبڵندی ئەو خوایە دەکاتەوە کە سەرپێچی بەرانبەرکردووە، بۆیە ترس وبیم دایدەگرێت، وەبیری ڕەحم وبەزەیی ومیهرەبانی ئەو دەکاتەوە دەست دەکات بە هەوڵ وکۆشش لەو پێناوەدا وهۆکارەکانی دەگرێتەبەر و داوای لێخۆشبوون وسڕینەوەی تاوانەکانیان لە خوا دەکەن، ئەوەش بەداپۆشینی وسزانەدانیان لەسەری، وە داوا لە هیچ کەسێکی تر ناکەن بۆ ئەو مەبەستە چونکە تەنها خوا دەسەلاتی ئەوەی هەیەو لەتوانایدا هەیە بۆیە ڕوو لەو دەکەن.

**سیفەتی شەشەم:** ﴿وَلَمْ يُصِرُّوا عَلَى مَا فَعَلُوا وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ واتە بەردەوام نابن لەسەر تاوان وگوناه، لەکاتێکدا دەزانن کە ئەوە تاوانەو سەختی سزاوتۆڵەی خواش دەزانن وڕەحم ونزیکی لێخۆشبوونی خواش دەزانن بۆیە وازدێنن و زوودەست هەڵدەگرن وڕوو دەکەنە تۆبەوپەشیمانی، سووربوون

وبــەردەوامی لەســەر تــاوان لەگــەڵ زانینــی ئــەو خاڵانــەی کەباسکران تاوانــە بــچووکەکان دەکــات بەگــەورەو بکەرەکــەی تووشی نەهامەتی وبەدبەختی دەکــات. بۆیــە کــاتی خۆیــەتی بەڕاســتی هەوڵ بــدەین ئــەو سیفەتە جوانانــە لــە خۆمانــدا بەرجەستە بکەین وخۆمانی پــێ برازێنینــەوە، چــونکە ســوێند بەخوا دونیامان بۆ دەکاتە بەهەشت و سەریشمان لەبەهەشــتی ئەو دونیاوە دەردەکات، جا کەوابێ ئایا مافی خــۆی نیــە کــە خۆمان وا لێبکەین بەرێزان با خەمی قیامەتمان هەبێ چەنکە ئــەو بــەرەو ئێمــە دێ وئێمــەش بــەرەو ئــەو دەڕۆیــن، پــێش هەزاروچواسەدوبیست ساڵ خوا فەرموویەتی قیامەت نزیکــەو نزیکیش بۆتەوە، ئەی ئێستا؟ خۆشەویستان کەســمان نــازانین کــەی دەمــرین بــەڵام دەزانــین کــە دەمــرین دەزانــین زینــدویش دەکرێینەوە، جا ئەگەر ئەو زانینە ســوودمان پــێ نەگەیــەنێت ئەوا بەدڵنیاییەوە زیانی هەیە بۆمــان .

**خوای گەورە لە ئایەتێکی بەپیزی تـردا هـەر سـەبارەت بەم باسە گرنگە دەفەرموێت :**

**﴿قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ (١) الَّذِينَ هُمْ فِي صَلاتِهِمْ خَاشِعُونَ (٢) وَالَّذِينَ هُمْ عَنْ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ (٣) وَالَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَاةِ فَاعِلُونَ (٤) وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ (٥) إِلاَّ عَلَى أَزْوَاجِهِمْ أوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ (٦) فَمَنْ ابْتَغَى وَرَاءَ ذَلِكَ فَأُوْلَئِكَ هُمْ الْعَادُونَ (٧) وَالَّذِينَ هُمْ لأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ (٨) وَالَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلَوَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ (٩) أُوْلَئِكَ هُمْ الْوَارِثُونَ (١٠) الَّذِينَ يَرِثُونَ الْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾(المؤمنون).**

واتە: بەڕاستی خـەڵکانی خـاوەن ئیمـان وبـڕوادار سـەرکەوتوو ڕزگارن، چونکە خاوەنی ئەم سیفەتە بەرزانـەن: ئەوانـەن کەلـە نوێژەکانیانـدا خۆشـکێن وملکەچـن وهـەردەم بەترسـەوە نوێژئەکەن وبەرانبەر بەخوا ئـەهلی شـەرمن، ئەوانەشـن کەلـە بەرانبەر کاروکرداری پڕوپووچ وشتی بێ ماناو بـێ سـوود ڕوو

هەڵدەسورێنن پشت هەڵدەكەن، وە ئەوانە بەهەژارو بێ نەوایان زەكـات دەدەن، وە پـارێزەری داوێنیـانن، خۆیـان لەهـەموو رێگەیەكی یاساغ وناشەرعی دەپارێزن وەلەهە جێ بـەجێكردنی ئارەزووەكانیان خۆڕاگرن، مەگەر لەگەڵ هاوسەری خۆیـان یـان لەگـەڵ كـەنیزانیان(ئەوانـەی مـوڵكی خۆیـانن) جـا بێگومـان لەورێیـەوە لۆمـەكراونابن ولێیـان نـاگیرێ، ئینجـا هەركەسـێ لەغەیری ئەو رێگایەوە هەوڵ بدا بۆ جێ بەجێكردنی ئارەزووی خۆی وەك زیناو نێربازی... ئەو جۆرە كەسانە ئەوە رەفتاریـان بێـت دەسـت درێژكـەرو سـنوور بـەزێنی لەئەندازەبـەدەرن، ئەوانەش كە چاودێرو ڕاگری سپاردەوبەڵێن وپـەیمانی خۆیـانن، وە ئەوانەش كەلەسەر نوێـژەكانیان دەوامكـارن وەیانپـارێزن، تەمەڵیان تێدا ناكەن ونایانفەوتێنن ولەكاتی خۆیدا بەتەواوی پایەومەرجەكانیـەوە جێبـەجێیان دەكـەن، هەر ئەوانـەن میراتگران وخاوەنی بەهەشت، ئەوانەی دەبنە خاوەنی (فیردەوس) بەهەشـتی بڵنـد وبـەمیرات ئەیبـەن، بەهەتاهـەتایش تێیـدا ئەمێننەوە.

ئەم ئایەتە پیرۆزە چەند سیفاتێکی بەهەشتیەکانمان بۆ باس دەفەرموێ، وا لەخوارەوە بەخاڵ باسیان لێوە دەکەین بۆ ئەوەی بۆ خوێنەری ئیسلام ویست روون بێت وخۆمانی پێ برازێنینەوە.

**سیفەتی یەکەم:** ﴿الْمُؤْمِنُونَ﴾ ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە بەخواو بەهەموو ئەو شتانەی کە دەبێت باوەڕی پێ بهێنرێت لە فریشتەو پەرتووکەئاسمانیەکان وپێغەمبەران ورۆژی دوایی وقەزاوقەدەر(خێروشەڕی)، باوەڕیان بەو شتانە هەیە بەباوەڕێك کە وەریان گرتووەو ڕازین لێی وملکەچن بۆی بەکرداروگوفتار.

**سیفەتی دووەم:** ﴿الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ﴾ دڵیان ئامادەیە لەنوێژداو ئەندامەکانی جەستەشیان ئارام وبێ جووڵەن، هەست بەوە دەکەن کە لەنوێژەکانیاندا وەستاون بەپێوە بەرانبەر خوای گەورەو میهرەبان بەفەرمایشت وگوفتاری پیرۆزی خۆی قسەی لەگەڵدا دەکەن وبەزیکروی... ئەو لێی نزیك دەبنەوە، وەبە دوعاوپاڕانەوە پەنای پێ دەبەن، ... بە دڵ وناخ وجەستەوە ئەوانە خاشعن وبیریان لای نوێژەکانیانە

**سیفەتی سێیەم:** ﴿وَالَّذِينَ هُمْ عَنْ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ﴾.

(**لەغو**) بریتیە لە هەموو ووتەوکردارێکی بێ سوودوبێ کەڵك، ئەوان لەمانە دوورن وتەنانەت هەر کۆڕومەجلسێك لەغویشی تێدا بکرێت ئەوان خۆیانی لێ دەپارێزن وبەشداری تێدا ناکەن لەبەر هیممەت بەرزی و زۆر سووربوونیان لەسەر چاکەکاری بۆیە کاتی بەنرخی خۆیان لەو شتانەدا بەسەرنابەن ونافەوتێنن، هەروەکو چۆن نوێژەکانیان بەخشوع دەپارێزن بەهەمان شێوەیش کاتەکانیان لەلەناوچوون دەپارێزن، ئەگەر ئەوانە خۆیان لەشتێ بپارێزن کە سوودی تێدا نەبێت ئەوا بەدڵنیاییەوە خۆیان لەشتانێك دەپارێزن کە زەرەروزیانی تێدایە.

**سیفەتی چوارەم:** ﴿وَالَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَاةِ فَاعِلُونَ﴾ ئەوانە زەکاتی ماڵەکەیان بەشێوەیەکی جوان دەردەکەن، بێ ئەوەی زۆرلەخۆیان بکەن وبەدڵ گرانییەوە ئەو پەرستشە ئەنجام بدەن، بەڵکو بە ڕووگەشی وبەخۆشحاڵیەوە مافی هەژارونەدارانی لێدەردەکەن.

**سیفەتی پێنجەم:** ﴿وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ (٥) إِلاَّ عَلَى أَزْوَاجِهِمْ أوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ﴾ ئەوانەی داوێنی خۆیان پاك ڕادەگرن ودەیپارێزن لەهەر کاروکردارێکی قیزەونی ناشەرعی وەك زینا ونێربازی، چونکە سەرپێچی خوای تێدایە و دارمانی ڕەوشتی وکۆمەڵگاییە، وەهەروەها چاویشیان لەنەزەرکردن وتێڕوانین بۆ نامەحرەم دەپارێزن ودەستیان لە بەرکەوتن ولێدانی جەستەی نامەحرەم دەپارێزن، وە زۆرێك لەزانایان ئەم ئایەتە دەکەنە بەڵگە لەسەر حەرام بوونی ئاوهێنانەوە بەدەست، چونکە ئەوە بەکارهێنانی داوێنە لەجگە لە خێزان وکەنیزەکدا.

**سیفەتی شەشەم:** ﴿وَالَّذِينَ هُمْ لأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ﴾ ئەمانەت ئەوەیە کە کردارێك یان گوفتارێك بەڕاسپاردە بزانرێت، جا ئەوەی بەنهێنی قسەیەکی لاتکرد ئەوا تۆی ڕاسپاردوە، وەئەوەی کارێکی ئەنجامدا لەلات وپێی ناخۆش بوو کەخەڵك پێی بزانێت ئەوا تۆی بەجێی

باوەڕداناوە، وەئەوەی شتێکی لادانای لەبەر دەستپاکیت ئەوا تۆی بەئەمین ودەستپاك داناوە، وەهەروەها ئەو پەیماننامەو گرێبەست ونەزرانەش دەگرێتەوە لەنێوانی خەڵکیدا کەئەنجام دەدرێت. هەربۆیە بەهەشتیەکان ئەمانەتی نێوان خۆیان وخواو خۆیان وخەڵکی دەپارێزن.

**سیفەتی حەوتەم:** ﴿وَالَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلَوَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ﴾ پارێزگاری دەکەن لەنوێژەکان لەوەی بڕوات...ان کەم وکورتی تێدا بکەن، ئەوەش بەوە دەبێت کە لە...اتی خۆیدا ...ەنجام بدرێت وبەشێوەیەکی دروست وتەواو ...رج وپایە... پێویستیەکانی بەجێ بهێنرێت.

**خو...ەری چاکەخواز:** خوای پەروەردگار لەقورئانەکە... لە زۆر ...نی تردا باسی سیفاتی بەهەشتیەکانی کردووە بە...ان وبەجوا...ترین وتەواوترین شێواز باسی فەرمووە، بەلام ئە...ەی باسکرا... لە سیفەتە هەرەگرنگ و زۆرپەیوەستەکانە بە...قی بەهە...بەوە، بەشێوەیەك کەهەریەك لەوانە لەتەواوکەری...انی

ئیمانه وكەم وكورتی تێیدا كەم وكورتیه لەئیمان وباوەڕ، دەبا پێكەوه كۆمەڵگەیەكی بەهەشتی پێك بهێنین بۆ ئەوەی ژیانی دونیامان وێنەی بەهەشت بێت و دوور بێت لەهەر سیفاتێكی نائیسلامی و نامرۆڤانه.

**وا ئێستا دێینه خزمەت فەرمووده شیرینەكانی پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) باسی سیفاتی بەهەشتیمان بۆ بكات:**

لەئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ)، پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێت : ((مَنْ سَلَكَ طَرِيقًا يَلْتَمِسُ فِيهِ عِلْمًا سَهَّلَ اللَّهُ لَهُ طَرِيقًا إِلَى الْجَنَّةِ)) [رواه مسلم] .

واته: ئەوەی ڕێگەیەك بگرێتەبەر بۆ بەدەستهێنانی زانست ئەوا خوای گەورە ڕێگەی چوونه بەهەشتی ئاسان دەكات.

لەهەمان سەرچاوەدا دیسان پێغەمبەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێت : ((أَلا أَدُلُّكُمْ عَلَى مَا يَمْحُو اللَّه بِهِ الْخَطَايَا وَيَرْفَع بِهِ الدَّرَجَات ؟ قالُوا : بَلَى يَا رَسُول اللَّه قَالَ : إِسْبَاغ الْوُضُوء

عَلَى الْمَكَارِهِ وَكَثْرَةَ الْخُطَا إِلَى الْمَسَاجِد وَانْتِظَار الصَّلَاة بَعْد الصَّلَاة )) [رواه مُسْلِم] واتە: ئایا هەواڵتان پێ بدەم سەبارەت بە شتێك كە تاوانی پێ دەسڕێتەوەو پلەوپایەی پێ بەرزدەبێتەوە؟ وتیان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، ئەویش فەرمووی: دەستنوێژگرتن بەتێروتەسەلی و بەتەواوی لەكاتی بوونی نەزیەت و نارەحەتی ،و زۆر هەنگاونان بۆ مزگەوت وچاوەڕێ كردنی نوێژ دوای نوێژ.

لەعومەری كوڕی خەتتابەوە(رەزای خوای لێ بێ)، پێغەمبەر(صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرمویێت : (( مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ يَتَوَضَّأُ ، فَيُسْبِغُ الْوُضُوءَ ، ثُمَّ يَقُولُ : أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ ، إِلَّا فُتِحَتْ لَهُ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ الثَّمَانِيَةِ ، يَدْخُلُ مِنْ أَيِّهَا شَاءَ )) [رواه مسلم] .

واتە: هیچ یەكێك لەئێوە نیە كە دەستنوێژ بەجوانی بگرێت وپاشان بڵێت: شاهێدی دەدەم كە هیچ پەرستراوێك نیە

شایستەی پەرستن بێت بەحەق جگە لە الله ومحمدیش بەندە ونێردراوی خوایە، ئەوا هەشت دەرگاکەی بەهەشتی بۆ دەکرێتەوەو لەهەرکامیەوە ویستی دەڕواتە ژوورەوە.

لە عوسمانی کوڕی عەففانەوە(ڕەزای خوای لێ بێ)، پێغەمبەر(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) دەفەرموێت : (( من بنى مسجداً يبتغِي بهِ وَجهَ الله بَنَى اللهُ لَهُ بيتاً فِي الجَنَّةِ )) [متفق عليه]

واتە: ئەوەی مزگەوتێك دروست بكات تەنها لەپێناوی خوادا ئەوا خوای گەورە ماڵێكی لەبەهەشت بۆ دروست دەكات.

لەعوبادەی کوڕی صامتەوە (ڕەزای خوای لێ بێ)، پێغەمبەر(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) دەفەرموێت : ((خَمْسُ صَلَوَاتٍ كَتَبَهُنَّ اللَّهُ عَلَى الْعِبَادِ فمن جاءَ بِهِنَّ و لم يُضَيِّعْ مِنهُنَّ شيئاً اسْتِخْفَافًا بِحَقِّهِنَّ كَانَ لَهُ عِنْدَ اللَّهِ عهداً أنْ يُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ)) [رواه الإمام أحمد و أبوداود والنسائي ، له طرق يقوى بعضها بعضاً]

واتە : پێنج نوێژن ئەوانەی کە خوای پەروەردگار فەرزی کردون لەسەر بەندەکانی ، جا ئەو کەسەی ئەنجامیان بدات بە تەواوی

و هیچیان لێ نەفەوتێنێ بە هۆی بایەخپێنەدانیان ، پەیمانی دەبێت لای خوای پەروەردگار کە بیخاتە بەهەشتەوە.

لە سەوبانەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) کە پرسیاری لە پێغەمبەر(صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)کرد دەربارەی کردەوەیەك کە بیخاتە بەهەشتەوە، ئەویش فەرمووی:

(( عليك بكثرةِ السجودِ فإنَّكَ لا تسجد للهِ سجدةً إلاّ رفعكَ اللهُ بِها درجةً وحطَّ عنك بِها خَطِيئَةً)) [رواه مسلم] .

واتە: ئەگەر ئەتەوێ بچیتە بەهەشتەوە ئەوا زۆر سوجدە بۆ خوا بەرە(زۆر نوێژبکە) چونکە هیچ سوجدەیەك نابەیت بۆ خوا ئیلا خوای گەورە پلەیەك بەرزت دەکاتەوەو هەڵەوتاوانێکت لەسەر دەسڕێتەوە.

لە ئوم حەبیبەوە (ڕەزای خوای لێ بێ)، پێغەمبەر(صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دەفەرموێت: (( ما من عبدٍ مسلمٍ يصلي لِلهِ تعالى في كلِّ يومٍ اثنتي عشرةَ رَكعَةً تَطَوُّعاً غيرَ فريضةٍ إلاّ بنى اللهُ لهُ بيتاً في الجنةِ)) [رواه مسلم].

واتە: هیچ بەندەیەك نیە کەلە هەموو ڕۆژێکدا دوازدە رکات نوێژی سوننەت بکات جگە لەفەرزەکان ئەوا خوا ماڵێکی لەبەهەشت بۆ دروست دەکات.

وە مەعازی کوڕی جەبەل (ڕەزای خوای لێ بێ) پرسیاری لە پێغەمبەر کردو وتی هەواڵم بدەرێ سەبارەت بە کردەوەیەك کە بمخاتە بەهەشتەوەو دوورم بخاتەوە لە ئاگر، ئەویش فەرمووی:

(( لقد سألتَ عن عظيم وإنه ليسيرٌ على من يسره الله عليه، تعبدالله ولاتشرك به شيئاً، وتقيم الصلاة، وتؤتي الزكاة، وتصوم الرمضان، وتحج البيت)) [رواه أحمد والترمذي وصححهُ].

واتە: بەڕاستی پرسیارت لەشتێکی گەورە کرد، وە ئاسانە بۆ کەسێك کە خوابۆی ئاسانی کردبێت، خواپەرستەوهاوبەشی بۆبڕیارمەدە، نوێژبکەو زەکات دەربکەو ڕۆژووی ڕەمەزان بگرەو حەجی ماڵی خوایش بکە.

لەسەهلی کوڕی سەعدەوە (ڕەزای خوای لێ بێ)، پێغەمبەر(صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلّمَ) دەفەرموێت: (( إن في الجنةِ باباً يقالُ لهُ الريَّان يدخل منهُ الصائمون يومِ القيامةِ لايدخل منهُ أحدٌ غيرهُمْ)) [متفق عليهِ].

واتە: لەبەهەشتدا دەرگایەك هەیە پێی دەوترێت ڕەیان کە تەنها ڕۆژووەوانانی پێدا دەڕۆنە ژوورەوە کەسی تری پێدا ناچێتە ژوور.

لەئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ)، پێغەمبەر(صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلّمَ) دەفەرموێت: (( العمرةُ إلى العمرة كفارةٌ لما بينهما، والحج المبرور ليس لهُ جزاءٌ إلا الجنة)) [متفق عليه]واتە: عومرەیەك بۆ عومرەیەکی تر دەبێتە کەفارەتی تاوان لەنێوانیاندا، وە حەجێکی قبولکراویش هیچ پاداشتێکی نیە بەهەشت نەبێت.

لەجابرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ)، پێغەمبەر(صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلّمَ) دەفەرموێت: ((مَنْ كَانَ لَهُ ثَلاَثُ بَنَاتٍ يُؤْويهنَّ

وَيَرْحَمُهُنَّ وَيَكْفُلُهُنَّ [وَيُزَوِّجهُنَّ](*) فَقَدْ وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ الْبَتَّةَ ، قِيلَ : يَا رَسُولَ اللَّهِ فَإِنْ كَانَتَا اثْنَتَيْنِ ؟ قَالَ : وَإِنْ كَانَتَا اثْنَتَيْنِ ، قَالَ : فَرَأَى بَعْضُ الْقَوْمِ أَنْ لَوْ قَالَ : وَاحِدَةً ؟ لَقَالَ : وَاحِدَةً)) [صحيح سنن الترمذي رقم : (٣٣٧٧)] .

واته : هەر کەسێك سێ کچی هەبێت و بیانگرێتە خۆی و بە خێویان بکات و بە بەزیی بێت بەرامبەریان و کەفالەتی دابین کردنی پێداویستی یەکانیان بۆ بکات و سەرپەرشتیان بکات و بیاندات بە شوو ئەوا بەهەشتی مسۆگەر کردووە بە هاتا هەتایی ، ووترا : ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر دوو کچیش بێت ؟ فەرمووی : ئەگەر دوو کچیش بێت ، دەڵێت : هەندێك لە خەڵکەکە وتیان : ئەگەر بوترایە : یەك کچیش؟ دەیفەرموو : یەك کچیش .

---

(*) قال الإمامُ المنذري في تخريج هذا الحديث : (رواه أحمد بإسناد جيد والبزار والطبراني في "الأوسط" وزاد : "**ويزوجهن**") ، قلت : أقر الشيخ الألباني قول المنذري هذا ونقله في "الصحيحة" مقراً لهُ أيضاً فقال : (والحديث أوردهُ المنذري في "الترغيب" : (٣ / ٨٤ ـ ٨٥) ، وقال : ((رواه أحمد بإسناد جيد والبزار والطبراني في "الأوسط" وزاد : "ويزوجهن")) ) سلسلة الأحاديث الصحيحة : (٣/٢٤ ـ ٢٥) الحديث رقم : (١٠٢٧).

لەئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) کە دەڵێت پرسیارکرا لەپێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) دەربارەی زۆرترین شتێك کە خەڵکی دەباتە بەهەشتەوە، ئەویش فەرمووی: ((تَقْوى اللهِ وحسنُ الْخُلق)) (رواه الترمذي وابن حبان في صحيحه). واتە: تەقوای خواو ڕەوشت جوانی.

بەڕێزان ئەوانەی کە باسکرا کۆمەڵێك بوو لەئاکارەکانی ئەهلی بەهەشت لە قورئان وفەرموودەکاندا، بە پشتیوانی خوا وا ڕووغان کردەوە بەزمانی شیرینی کوردی بۆ کەسێك کەبەهەشتی دەوێت وئەیەوێ پێی بگات .

أسأل الله أن ييسر لنا ولكم سلوكها ويثبتنا عليها إنه جوادٌ كريمٌ وصلى الله وسلم على نبينا محمدٍ وآلِهِ وصحبِهِ أجمعينَ.